# سێ بنچینەکەی بیروباوەڕی ئیسلام وبەڵگەکانی

< کوردي >

 

شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت )



وەرگێڕانی: ئومێد عومەر چرۆستانی

پێداچونەوەی: پشتیوان سابیر عەزیز

# الأصول الثلاثة

## وأدلته

< كردي >




الشيخ محمد بن عبد الوهاب ( رحمه الله )



ترجمة: أوميد عمر علي

مراجعة: بشتيوان صابر عەزيز

# سێ بنچینەکەی بیروباوەڕی ئیسلام وبەڵگەکانی




## پێشەکی :

إن الحمد لله، نحمدُه ونستغفره ونستعينه ونستهديه ونعوذُ بالله من شرورِ أنفسنا ومن سيئاتِ أعمالنا، من يهْدِ اللهُ فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له .وأشهد أنْ لا إله إلا اللهُ وحده لا شريك له وأشهد أنَّ محمداً عبدُه ورسولُه، بعثه اللهُ رحمةً للعالمين هادياً ومبشراً ونذيراً .بلّغ الرسالة وأدّى الامانة ونصحَ الأمّةَ فجزاهُ اللهُ خيرَ ما جزى نبياً من أنبيائه. صلواتُ اللهِ وسلامه عليه وعلى جميع الأنبياء والمرسلين، وعلى صحابته وآل بيته، وعلى من أحبهم إلى يوم الدين.

خۆشەویستان ئەم پەرتووکەی بەردەستتان دەقی تەرجەمەکراوی پەرتووکی ( سێ بنچینەکەی بیروباوەڕی ئیسلام وبەڵگەکانی ) کە بە ( الاصول الثلاثة ) ناسراوە، مەبەست پێی ناسینی خوای گەورەیە بەو شێوەیەی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) باسیان لێوە کردووە، لەگەڵ ناسینی ئاینی پیرۆزی ئیسلام وشەریعەتە بێ وێنە و بێ هاوتاکەی کە خوای گەورە ڕازی بووە کۆتا ئاینی مرۆڤایەتی بێت، پاشان ناسینی پێغەمبەری خوا محمد المصطفى درودی خوای لەسەر بێت بەبێ نواندنی جەفا وکەمتەرخەمی و هیچ زیادە ڕۆییەك لە ئاستیدا ..

ئەم پەرتووکە دانراوی شێخی ئیسلام موحەممەدی کوڕی عبد الوهابی تەمیمی یە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) ئومێد چرۆستانیش هەستاوە بە وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی، بەو هیوایەی إن شاء الله ببێتە مایە ڕەزامەندی خوای گەورە وپاشان خوێنەرانی بەڕێزی، ئێســـتاش ئێوە و پێشکەش کردنی وەرگێڕانی ئەو پەرتووکە .

## بەناوی خوای بەخشندە ومیهرەبان

ڕەحمەتی خوات لێ بێت بزانە کە فێربوونی چوار بابەت واجبە لەسەرمان :

**یەکەم :** زانست : کە بریتیە لە ناسینی خوای گەورە وپێغەمبەرەکەی وناسین وشارەزا بوون لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە بەڵگەوە .

**دووەم :** کارکردن بەو زانستەی کە بەدەستت هێناوە .

**سێهەم :** بانگەوازکردنی خەڵکی وشارەزاکردنیان لە کاروباری ئاینەکەیان .

**چوارەم :** خۆڕاگرتن وئارامگرتن لەسەر ئەو نارەحەتی و ناخۆشیانەی لەو ڕێگایەدا دێنە ڕێت .

بەڵگەش لەسەر ئەمە، پەروەردگاری بالادەست فەرموویەتی : ﴿ وَالعَصْرِ *إِنَّ الأِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ* إِلا الذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ﴾ **[** سورەتی العصر : **1 – 3 ]** .

واتا : سوێند بێت بە کات وزەمان * مرۆڤەکان لە زیان و زەرەردان * تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بەڕاستیی ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن و خۆیان لە گوناە و خراپەکاریی دەپارێزن ... وە هانی یەکتری دەدەن بۆ شوێنکەوتنی ڕێبازی حەق و جێبەجێکردنی هەموو کارێکی هەق و ڕەوا.... هەروەها هانی یەکتری دەدەن لەسەر خۆ ڕاگرتن و ئارامگرتن لەسەر هەموو بەڵاو ڕوداوێکی ناخۆش و گرفتەکانی ژیان کە دێتە ڕێگایان .

ئیمامی شافیعی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لە بارەی ئەم سورەتە پیرۆزەوە ووتویەتی : ئەگەر خوای گەورە وپەروەردگار جگە ئەم سورەتە هیچ بەڵگەیەکی تری دانەبەزاندایە بۆ دروستکراوەکانی، ئەوا بەسیان بوو .

ئیمامی بوخاری ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) ئەڵێت : دەروازەی زانست لە پێش گوفتار و کردارەوەیە، بەڵگەش لەسەر ئەم بابەتە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلا اللهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِك ﴾ **[** سورەتی محمد : **19 ]** .

واتا : ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یان ئەی مرۆڤ! چاك بزانە کە جگە لە خودا هیچ خودایەکی تری بەهەق نیە و داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە بۆ لێخۆش بوونی گوناهەکانت .

خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بە زانست وزانیاری دەستی پێکردووە پێش گوفتار و کردار .

ئەی خوشك وبرای باوەڕدارم ( ڕەحمەتی خوات لێ بێت ) بزانە کە واجب و پێویستە لەسەر هەموو پیاو وئافرەتێکی موسڵمان ئەم سێ بابەتە بەجوانی فێر ببێت و پاشان کرداریشیان پێ بکات :

یەکەم : بێگومان خوای گەورە وپەروەردگار دروستی کردوین و ڕزق ورۆزی داوین، وە بزانە هەروا وازی لێ نەهێناوین، بەڵکو پەیامبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوین، هەرکەسێك گوێڕایەڵی بکات دەچێتە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێکیش سەرپێچی بکات دەچێتە دۆزەخەوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە، خوای گەورە فەرمـــوویەتی : ﴿ إِنَّا أَرْسَلنَا إِليْكُمْ رَسُولاً شَاهِداً عَليْكُمْ كَمَا أَرْسَلنَا إِلى فِرْعَوْنَ رَسُولاً*فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُول فَأَخَذْنَاهُ أَخْذاً وَبِيلاً ﴾ [ ســورەتی المزمل : **15 -16** ] .

واتا : ئەی بێ باوەڕینە! ئێمە پێغەمبەرمان بۆ ناردن، تا ڕێگای ڕاستتان نیشان بدات و لەسەر بیروباوەڕو کردەوەکانتان ببێتە شایەت، هەروەکو موسامان بە پێغەمبەرایەتی نارد بۆ سەر قەومی فیرعەون، کە قەومێکی بێ باوەڕ بوون، بەڵام فیرعەونیش وەکو ئێوە ملهوڕیی نواندو لە موسا یاخیی بوو، لەبەر ئەوە زۆر بە توندیی گرتمانن و بە سەرەنجامێکی زۆر ناخۆش و قورس لە دەریادا نوقمان کردن .

دووەم : خوای گەورە ڕازی نابێت هیچ کەسێکی تر لە پەرستن و بەندایەتی کردنیدا بکرێتە هاوبەش و هاوەڵی، نە هیچ فریشتەیەکی نزیك لەخۆی، وە نە هیچ پێغەمبەر و نێراوێکی تر، بەڵگەش لەسەر ئەمە، خوای گەورە وپەروەردگار فەرمooویەتی : ﴿ وَأَنَّ المَسَاجِدَ للهِ فَلا تَدْعُو مَعَ اللهِ أَحَداً ﴾ [ سورەتی الجن : **18** ] .

واتا : بێگومـــان مزگەوتەکان هی خودان و جێگای پەرستنی ئەون، لەوێ لە خودا زیاتر پەنا بۆ کەسێکی تر مەبەن و داوای یارمەتی لە کەسێکی تر مەکەن .

سێهەم : بێگومان ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بێت، وە خودای بەیەکتایی پەرستبێت، دروست نیە بۆی دۆستایەتی و پشتگیری کەسێك بکات کە دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەگەر چی ئەو کەسانەشی کە پشتیوان و پشتگیریان دەکات نزیکترین کەسیشی بن، بەڵگەش لەسەر ئەمە پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولهُ وَلوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولئِكَ كَتَبَ فِي قُلوبِهِمُ الأَيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولئِكَ حِزْبُ اللهِ أَلا إِنَّ حِزْبَ اللهِ هُمُ المُفْلحُونَ ﴾ [ سورەتی المجادلة : **22** ] .

واتا : تۆ هیچ قەوم و کۆمەڵێکت دەست ناکەوێت بەڕاستی باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەبێت، لە هەمان کاتدا خۆشەویستی و دۆستایەتی لەگەڵ کەسێك یان کۆمەڵێکدا ببەستن، کە بە کردەوەیان دوژمنایەتی لەگەڵ خوداو

پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بکەن، با ئەو کەسانە باوکیشیان بن یان کوڕەکانیان بن یاخود براکانیان بن یان لە عەشرەت و ڕەگەزی خۆیان بن... جا ئەوانەی کە بەو شێوەیە بن، ئەوە خودا ئیمانی لە دڵیاندا جێگیر کردووەو لەلایەنی خۆیەوە یارمەتی داون، لە ڕۆژی دواییشدا دەیانخاتە ناو باخ و باخاتی ئەو بەهەشتەوە، کە چەندەها ڕووبار بەژێریاندا تێدەپەڕێت و هەتا هەتایە تیایدا دەمێننەوەو بۆ خۆیان ڕادەبوێرن و خودا لێیان ڕازی دەبێت و ئەوانیش بەو نیعمەت و بەخششانەی کە خودا پێی بەخشیون لە خودا ڕازی دەبن... ئەوانە حیزب و کۆمەڵی خودان، جا ئاگادار بن کە بەڕاستیی هەر حیزب و کۆمەڵی خوداو پەیڕەوانی فەرمانەکانی ئەو سەرکەوتوو سەرفرازن ..

## بنەما وبنچینەی یەکەم : ناسینی پەروەردگار ( الله جل جلاله )

بزانە وئاگاداربە خوای گەورە ڕێنومایکار و ڕێنشاندەرت بێت بۆ پەرستن وعیبادەتی خۆی، بێگومان پاکیەتی ڕێبازی ئیبراهیم ئەوەیە کە خوای گەورە ( الله جل جلاله ) بە یەکخوایی بپەرستیت، وئاینداریت بەدڵسۆزی و ئیخلاص هەر بۆ ئەو بێت، هەر بەمەش خوای گەورە فەرمانی کردووە بە سەرجەم خەڵکی، و هەر بۆ ئەمەش دروستی کردوون، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الجِنَّ وَالأِنْسَ إِلا لِيَعْبُدُونِ ﴾ [ سورەتی الذاريات : 56 ] .

واتا : من جنۆکە و مرۆڤم تەنها بۆ پەرستنی خۆم دروستکردووە .

مەبەست لە ووشەی ( يعبدون ) یەکخواپەرستیە، گەورەترین فەرمانێکیش کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە بریتیە لە یەکخواپەرستی، کە مەبەست پێی تەنها و تەنها ( الله جل جلاله ) بپەرستیت، و گەورەترین شتێکیش کە خوای گەورە ڕێگری لێ کردبێت هاوەڵ بڕیاردانە بۆی، کە مەبەست پێی هاوارکردن و پاڕانەوەیە لە غەیری ئەو، بەلگەش بۆ ئەمە، خوای گەورە فەرموویەتی : ( وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾ [ **سورەتی : النساء : 36** ] .

واتا : (ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن .

ئەگەر پێیان ووتیت : ئایا ئەو سێ بنەما و بنچینەیە کامانەن کە واجب و پێویستە مرۆڤ شارەزایان بێت ؟

لە وەڵامدا بڵێ : بەندە پەروەردگاری خۆی وئاینی خۆی وپێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) چاك بناسێت .

ئەگەر پێیان وتیت : پەروەردگارت کێیە ؟

لەوەڵامدا بڵێ : پەروەردگارم ( الله ) یە کە پەروەردەی کردووم، و تەواوی جیهان و دروستکراوەکانی تریشی بە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردە کردووە، هەر ئەویش پەرستراوی منە و جگە لەویش هیچ خوا

وپەرستراوێکی ترم نیە، بەڵگەش لەسەر ئەمە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ الحَمْـدُ للهِ رَبِّ العَـالَمِينَ ﴾ [ سـورەتی الفاتحة : 1 ] .

واتا : هەرچی سوپاس وستایشە بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، هەموو شـتێکیش جگـە لە پەروەردگار ( الله جل جلاله ) دروستکراو ولە چوارچێوەی جیهاندایە، منیش یەکێکم لەوانەی لەو جیهانەدان.

ئەگەر پێیان ووتیت : بەچی شتێکدا پەروەردگارت ناسی ؟

لە وەڵامدا بڵێ : بە نیشانە ودروستکراوەکانیدا، لە نیشانەکانی ئەو شەو ورۆژ و خۆر و مانگە، وە لە دروستکراوەکانی : هەر حەوت ئاسمانەکە وهەر حەوت زەویەکە و ئەوەیشی تێیدا هەن و ئەوەیشی لە نێوانیاندایە .

بەڵگەش لەسەر ئەمە : خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ اللَيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالقَمَرُ لا تَسْجُدُوا للشَّمْسِ وَلا للقَمَرِ وَاسْجُدُوا للهِ الذِي خَلقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ [ سورەتی فصلت : 37 ] .

واتا : لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵکو سوژدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللهُ الذِي خَلقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى العَرْشِ يُغْشِي اللَيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لهُ الخَلقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ العَالَمِينَ ﴾ [ سورەتی الاعراف : 54 ] .

واتا : بێگومان پەروەردگارتان (الله) یە کە ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستکرد، پاشان بەرز بویەوە سەر عەرش ( ئەڵبەتە چۆنیەتیی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایەتی و گەلێ شتی لەو بابەتانە لەرادەی بۆچوونی ئێمە بەدەرە، تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا مالیك و ئەحمەد پرسیووە، لە وەڵامدا وتوویانە: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕ بوون پێی واجبە)، بەشەو، ڕۆژ دادەپۆشێت؛ لەکاتێکدا بەشێنەیی عەوداڵە بەدوایدا، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان) بە فەرمانی خوا کەوتوونەتە گەڕو لە فەرمانی دەرناچن، ئاگادار بن و بزانن هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، ( کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین)، موبارەك و پیرۆزو گەورەیە زاتی (الله) پەروەردگاری جیهانیان .

مەبەست لە ووشەی ( رب ) پەرستراوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الذِي خَلَقَكُمْ وَالذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لعَلكُمْ تَتَّقُونَ * الذِي جَعَل لكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَل مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لكُمْ فَلا تَجْعَلوا للهِ أَنْدَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلمُونَ ﴾ [ سورەتی : البقرة : **22 –23** ] .

واتا : ئەو خودایەی کە ئەم زەویەی بۆ کردوون بەڕایەخ و، تیایدا دەژین و بە ئاسانیی بەسەریدا دێن و دەچن.. ئەو خودایەی کە ئاسمانی بەشێوەیەك دامەزراندوە کە هەموو ئەو ئەستێرانە تیایدایە بە یاسای کێشکردن بەیەکترەوە بەستراونەتەوەو ، هەریەکەیان لەسەر خولگەی خۆیان لە خولانەوەدان ، بەبێ ئەوەی بەر یەکتری بکەون.. ئەو خودایەی کە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت ، کە دەبێتە هۆی سەوز بوونی گشت جۆرە میوەو سەوزەجاتێك ، تابیێتە ڕزق و ڕۆزی بۆ ئێوە،کەوا بێت کەس مەکەنە هاوتای خودا، چونکە ئەگەر ئێوە نەختێك سەرنج بدەن دەزانن کە خودا تاك و بێ هاوتایەو ، لەو زیاتر هیچ کەسێك توانای هیچی نیەو، شایستەی ئەوە نیە کە بپەرسترێت و پەنای بۆ ببرێت ، جا ئەو کەسە زیندوو بێت یان مردوو، بتێك بێت، یـــان قەبری پیاو چاکێك .

ابن کەثیر ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا ئەڵێت : دروستکار و خالیقی ئەم هەمووە شتانە شایستەی ئەوەیە عیبادەتی بکرێت و بپەرسترێت .

جۆرەکانی پەرستنیش کە خوای گەورە وپەروەردگار فەرمانی پێکردووە، نمونەیان وەك پایەکانی ئیسلام و ئیمان و ئیحسان، هەروەها نزا وپاڕانەوە و هیوا و ئومێد پێ بوون، و پشت وپەنا پێ بەستن وترسان لێی، وحەزکردن و ترس لەشتێك لەگەڵ کارکردن لە پێناو دوورکەوتنەوە لێی، وخشوع بۆی، وترس لێی لەسەر بنەمای دڵنیا بوون لە گەورەی ودەسەڵاتی ئەو، لەگەڵ گەڕانەوە بۆ لای خوا، وداوای یارمەتی کردن لێی، وپەنا گرتن پێی، و هانا بۆ بردنی لەکاتی تەنگانەدا، وە سەربڕین وقوربانی بۆ کردن، ونەزر کردن، وجگە لەمانەیش ژمارەیەکی تری پەرستن هەن کە خوای گەورە جل جلالە فەرمانی کردووە کە هەموویان هەر بۆ ذاتی هەق تەعالای ( الله ) بن، بەڵگەش لەسەر ئەمە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ للهِ فَلا تَدْعُو مَعَ اللهِ أَحَداً ﴾ **[** سورەتی الجن : **18 ]** .

واتا : بێگومان مزگەوتەکان هی خودان و جێگای پەرستنی ئەون، مەبەست ئەوەی مزگەوتەکان تەنها شوێنی پەرستنی پەروەردگارن، لەوێ لە خودا زیاتر پەنا بۆ کەسێکی تر مەبەن و داوای یارمەتی لە کەسێکی تر مەکەن .

هەرکەسێك  شتێك لەم بەندایەتی و پەرستنانە بۆ غەیری ( الله جل جلاله ) ئەنجام بدات، بێگومان ئەو کەسە دەچێتە ڕیزی هاوەڵ بڕیاردەران و بێباوەڕانەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللهِ إِلهاً آخَرَ لا بُرْهَانَ لهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الكَافِرُونَ ﴾ [ سورەتی المؤمنون : 117] .

واتا : ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی خواو هاوار وهانای بۆ بەرێت، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە، ئەوە بە ڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگاریێتی، بێگومان بێ باوەڕو خوا نەناسان سەرفراز نابن .

لە فەرموودەی پێغەمبەری خودایشدا هاتووە ( صلى الله عليه وسلم ) کە فەرموویەتی : { الدعاء مخ العبادة }[1] واتا : نزا وپاڕانەوە کاکڵە وناوەرۆکی پەرستنە، بەڵگەش لەسەر ئەمە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لكُمْ إِنَّ الذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾ [ سورەتی غافر : 60 ] .

واتا : پەروەردگارتان فەرمووی : داوا لە من بکەن و لە من بپاڕێنەوە ، منیش وەڵامتان دەدەمەوە، بێگومان ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن لە بەرامبەر پەرستنمدا، بە سەرشۆڕی وڕیسوایی دەچنە دۆزەخەوە .

بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت تەنها لەخوای گەورە بترسیت ، ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَلا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ [ سورەتی ال عمران : 175 ] .

واتا : ئێوە ئەی موسڵمانینە! لە دوژمن و دۆستەکانی شەیتان مەترسن ، بەڵکو هەر لە من بترسن، ئەگەر ئێوە بەڕاستی ئیماندارن .

وە بەڵگەی ئومید و هیوا بوون بە خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لقَاءَ رَبِّهِ فَليَعْمَل عَمَلاً صَالحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً ﴾ [ سورەتی الكهف : 110 ] .

واتا : جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری خۆی شاد بێت، با کردەوەی چاك ئەنجام بدات و جگە لە خودا هیچ کەسێکی تر نەپەرستێت و، لە غەیری ڕەزامەندیی خودا زیاتر لە خەمی ڕەزامەندیی کەسی دیکەدا نەبێت... چونکە هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی کەسێکی تر لەگەڵ ڕەزامەندیی پەروەردگاردا، دەبێتە هاوەڵدانان بۆ خودا .

(1) ئەوەی ڕاست بێت { الدعاء هو العبادة }.

بەڵگەی پشت و پەنا بەستن بەخوای گەورە، وەك فەرموویەتی : ﴿ عَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ [ سورەتی المائدة : 23 ] .

واتا : جا کەوایە مەترسن و تەنها پشت بە خودا ببەستن، ئەگەر ئێوە باوەڕی تەواوتان بە خوداو بە پێغەمبەرەکەی هەیە، هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ﴾ [ سورەتی الطلاق : 3 ] .

واتا : هەر کەسێ پشت بەخوا ببەستێ لەکاروبارەکانیدا ئەوە خوای بەسە کە پشتیوان و یارمەتیدەری بێت .

بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت باوەڕدار حەزلێکردن وترسان وملکەچی هەر بۆ ذاتی هەق تەعالای ( الله ) بێت، پەروەردگار لەم بارەیەوە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ﴾ [ سورەتی الانبياء : 90 ] .

واتا : بێگومان باوەردارانی ڕاستەقینە کە پێغەمبەران پێشەنگی ئەمەن پێشبڕکێیان دەکرد لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا، وە نزای بەکوڵیان دەکرد، بە ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان، ئەوانە هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە.

بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت هەر لە خوای گەورە ( الله جل جلاله ) بترسیت، لەگەڵ باوەڕ بوون و دڵنیا بوون لەگەورەیی و تەواوی دەسەڵاتی ئەو زاتە پیرۆزە، ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە فەرموویەتي : ﴿ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي ﴾ [ سورەتی البقرة : 150 ] .

واتا : دەسا ئێوە لە پیلانی ستەمکاران مەترسن و، گوێ بۆ قسەشیان مەگرن, بەڵکو تەنها لە من بترسن .

بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت تەنها ڕووت لە پەروەردگار بێت بۆ تەوبە کردن وگەڕانەوە بۆ لای ئەو، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَه ﴾ [ سورەتی الزمر : 54 ] .

واتا : بەردەوام دڵتان لای خوابێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن،

بەڵگەی داوای یارمەتی وکۆمەکی کردنیش کە دەبێت هەر لە خوای گەورە داوا بکرێت، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ [ سورەتی الفاتحة : 5 ] واتا : ئەی پەروەردگار تەنها هەر تۆ دەپەرستین وتەنها هەر لەتۆیش داوای یارمەتیی و کۆمەك وپشتیوانی دەکەین .

هەروەها لە فەرموودەی صەحیحیشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : { إذا استعنت فاستعن بالله} واتا : هەرکاتێك داوای یارمەتی و کۆمەکیت کرد، ئەوە تەنها هەر لەخوای گەورەی داوا بکە .

بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت هەر پەنا بەخودا بگیرێت، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُل أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ [ سورەتی الناس : 1 ] واتا : ئەی موحەمەد بڵێ :پەنا دەگرم بە پەروەردگاری هەموو خەڵکی .

وە بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت داوای بەهاناوە هاتن وفریاکەوتن هەر لەخوا بکرێت، پەروەرگار فەرموویەتی : ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لكُمْ ﴾ [ سورەتی الانفال : 9 ] .

واتا : یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە لەجەنگی بەدردا نارەحەت بوون و لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە و داوای یارمەتیتان لێ دەکرد کە سەرتان بخات بەسەر دوژمنەکانتاندا، ئەوە بوو خوایش خێرا هات بە هاناتانەوە وسەری خستن .

بەڵگەی ئەوەش کە دەبێت سەربڕین وقوربانی کردن هەر بۆ خوای گەورە بێت، پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ قُل إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي للهِ رَبِّ العَالمِينَ * لاشَرِيكَ لهُ وَبِذَلكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّل المُسْلمِينَ ﴾ [ سورەتی الانعام 162 -163 ] .

واتا : ئەی پێغەمبەر! بڵێ: بەڕاستی نوێژ و حەج و قوربانیی و ژیان و مردنم گشت هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە * هیچ هاوەڵ و هاوتایەکی نیە، وە خودایش بەوە فەرمانی پێکردووم.. من یەکەمین موسڵمانم کە بە تەواوی ڕوو دەکەمە خوداو فەرمانەکانی بەجێ دێنم.

لەفەرموودەی پێغەمبەری خوایشدا هاتووە ( صلى الله عليه وسلم ) کە فەرموویەتی : { لعن الله من ذبح لغير الله } واتا : نەفرینی خوا لەو کەسە بێت کە ئاژەڵ وقوربانی بۆ جگە لەخوا سەر دەبڕێت .

بەڵگەی نەزریش، کە مرۆڤ بڕیار بدات شتێك تەنها لەسەر خۆی پێویست بکات خوای گەورە، لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی : ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْماً كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً﴾ [ سورەتی الانسان : 7 ] .

واتا : بەندەکانی خودا ئەو کەسانەن کە هەر کارێکی خێر لەسەر خۆیان بڕیار بدەن، بەبێ دواکەوتن و بەڵێن شکاندن ئەنجامی دەدەن و لە ڕۆژێك دەترسن ( کە مەبەست پێی قیامەتە) شەڕو ناخۆشییەکەی بە هەموو شوێنێکدا بڵاو دەبێتەوە .

**بنەما وبنچینەی دووەم : ناسین و شارەزا بوون لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە بەڵگە و لەسەر چاو ڕوونی .**

ئەویش بریتیە لە تەسلیم بوون بە خوای گەورە و پەوەردگار وپەرستنی بەیەکخوای، و پابەند بوون پێوەی بە گوێڕایەڵی کردنی، وخۆ بەری کردن ودوور کەوتنەوە لە هاوەڵ بڕیاردەران وشوینکەوتوانی .

ئەمەش سێ پلەیە : ئیسلام مەبەست پێی موسڵمان بوونە، لەگەڵ ئیمان وباوەڕ هێنان، وە هەروەها ئیحسان وچاکەکاری، هەر یەکێك لەم پلانەش پایە و ڕوکنی خۆی هەیە .

**پلەی یەکەم** : پایە و ڕوکنەکانی ئیسلام پێنجن : شاهیدیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە ( الله ) وە بێگومان موحەمەدیش پێغەمبەری خودایە، وە بەجێگەیاندنی پێنج نوێژە فەرزەکە، وە دەرەکردنی زەکاتی ماڵ وسامان، و ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، و حەج کردنی ماڵە ڕێز وحورمەت لێگراوەکەی خوا .

بەڵگەی شایەتومان، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ شَهِدَ اللهُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلا هُوَ وَالمَلائِكَةُ وَأُولو العِلمِ قَائِماً بِالقِسْطِ لا إِلَهَ إِلا هُوَ العَزِيزُ الحَكِيمُ ﴾ [ سورەتی ال عمران : **18** ] .

واتا : خوا شاهیدی دەدا کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لەئەو ، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش ( لە پێغەمبەران و زانایان ) کە بەڕێگەیەکی ڕاست و دروست دەیسەلمێنن خوا هەمیشە داد پەروەری ڕەهایە و جگە لەوزاتە خوایەکی تر نیە و ئەو خوایەکی بالادەست و دانایە.

مەبەست پێی ئەوەیە : هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە ( الله )،،، ( لا إله ) هەموو پەرستراوێکی جگە لە ( الله ) ڕەتدەکاتەوە و بە نارەوای دەزانێت، ( إلا الله ) یش هەموو پەرستن و بەندایەتی کردنێك بۆ خوای گەورەی بێ هاوەڵ و بێ هاوتا ثابت وجێگیر دەکات، هیچ هاوەڵێکی نیە لە پەرستندا، هەروەك چۆن هیچ هاوەڵێکیشی نیە لە موڵك ودەسەڵاتیدا، تەفسیر و ڕاڤەی ئەمەش ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیکات کە خوای گەورە لە جێگایەکی تردا فەرموویەتی : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ * إِلا الذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ * وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ [ سورەتی الزخرف : **26 -28** ] .

واتا : ئەی موحەمەد ئەو کاتە بیهێنەوە یادي خۆت کە ئیبراهیم بە باوکی و هۆزەکەی خۆی وت: بەڕاستی من دوورە پەرێزم لەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن * من تەنها خودا دەپەرستم، ئەو خودایەی کە لە نەبوونەوە هێناومیەتیە بوون،

بێگومان هیدایەتیشم دەدات و ڕێگای ڕاستیشم بۆ ڕوون دەکاتەوە * ئەوسا ئیتر ئیبراهیم ( سەلامی خودای لێ بێت) ئەو بەرنامە یەکخواپەرستیەی لەناو نەوەکانیدا بە بەردەوامیی هێشتیەوە، تا ئەگەر هەرکەسێك ڕێگای یەکخواپەرستی لێشێوا هەرچی زووترە بگەڕێتەوە بۆ لای.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ قُل يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلا نَعْبُدَ إِلا اللهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللهِ فَإِنْ تَوَلَوْا فَقُولوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ [ سورەتی ال عمران : **64** ] .

ئەم ئایەتە ڕوو دەکاتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێی دەفەرموێت بە خاوەن نامەکان لە جولەکەو گاورەکان بڵێ : وەرن بۆ لای ووتەیەکی یەکسان لەنێوان ئێمە وئێوەدا .. ئەویش ئەوەیە لە خودا زیاتر کەسێکی تر نەپەرستین و، هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین، وەهیچ کەسێکمان کەسێکی تر بە خاوەن شەریعەت و خاوەن فەرمان نەزانین، کە شایستەی ملکەچ کردن بێت بۆی و ببێتە هاوەڵ بۆ خودا لە بڕیارداندا.. جا ئەگەر ئەوان پشتیان هەڵکردو لەسەر بیروباوەڕی هەڵەی خۆیان مانەوە، ئەوکات پێیان بڵێ: ئێوە شایەت بن، ئێمە باوەڕمان بەوشتانە هەیە کە ووتمان و ملکەچ و گوێڕایەڵین و لە خودا زیاتر هیچ شتێکی دیکە ناپەرستین .

بەڵگەش لەسەر شاهیدیدان بەوەی کە موحەمەد پێغەمبەر ونێردراوی خوایە، پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ [ سورەرتی التوبة : **128** ].

واتا : ئەی خەڵکینە! ئێوە پێغەمبەرێکتان لە خۆتان بۆ هاتووە، بۆ ئەوەی فەرمانی خوداتان پێ ڕابگەیەنێت، زەرەر و زیانی ئێوەی پێ ناخۆشە و ئازاری پێ دەگات، وە زۆر بە پەرۆشە بۆتان و خەمی گەورەی ئەوەیە ڕوو بکەنە هیدایەت و ڕێگای ڕاستی هیدایەت بگرنە بەر، هەروەها دڵی لەلای ئیماندارانەو، زۆر بە بەزەیی و میهرەبانە لەگەڵیانداو زۆریش خۆشی دەوێن .

مەبەست لە شاهیدیدان کە موحەمەد پێغەمبەری خودایە، گوێڕایەڵی بیت لەوەی فەرمانی پێکردووە، و بەڕاستی بزانیت لەوەی هەواڵی پێداوە، وە دوربکەویتەوە لەوەی قەدەغە وسەرزەنشی کردووە، وە بەهیچ شێوەیەك بەندایەتی و پەرستن ئەنجام نەدەیت بەو شەریعەتە نەبێت ئەو هێناویەتی .

بەڵگەی نوێژکردن و زەکاتدان و ڕاڤەی یەکخواپەرستی، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلا لِيَعْبُدُوا اللهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ ﴾ [ سورەتی البينة : **5** ] .

واتا : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەرێك و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی خوا .

بەڵگەی ڕۆژوو گرتنیش، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ [ سورەرتی البقرة : **183** ] .

واتا : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە! ڕۆژوو گرتنتان لەسەر فەرز کراوە، هەروەکو لەسەر خاوەن ئایینەکانی پێش ئێوە فەرز کرابوو، تاوەکو خۆتان لە خراپە بپارێزن و بەندایەتی خودای خۆتان بکەن .

بەڵگەی حەجکردنیش، پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ العَالَمِينَ ﴾ واتا : خوا حەجی کەعبەی بڕیارداوە لەسەر مەردم، لەسەر ئەوەی توانای ڕێگای هەبێت، و هەرکەسێکیش باوەڕی بەو حەجە نەبێ، ئەوە باچاك بزانێ کە کافرو بێ باوەڕە، بەراستیی خوایش لەتەواوی خەڵکانی جیهان، نەك تەنها هەر لەوان، بێ نیازە .

**پلەی دووەم** : باوەڕ : حەفتاو هێندە بەشە، بەرزترینیان ووشەی ( لا إله إلا الله ) یە، ونزمترینشیان لادانی ئازار و نارەحەتیە لەسەر ڕێگای خەڵکی، شەرم وشکۆیش بەشێکە لەباوەڕ، پایەکانی باوەڕیش شەش دانەن : باوەڕت بە خوای گەورە ( الله جل جلاله ) ، بە فریشتەکان و بە کتێب و نامە ئاسمانیەکان، وبە پێغەمبەران، و بەڕۆژی دوایی، وبە قەدەری خێر و شەڕ هەبێت .

بەڵگەش لەسەر ئەم شەش پایە، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ وَلَكِنَّ البِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ وَالمَلَائِكَةِ وَالكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ﴾ [سورەتی : البقرة : **177** ] .

واتا : ڕووکردنە ڕۆژهەڵات و ڕووکردنە ڕۆژئاوا نیشانەی باشیی و چاکەکاریی نیە، بەڵکو چاکەکردن و نزیکبوونەوە لە خودا بەوە دەبێت کەسێك بە هەموو دڵێکیەوە باوەڕی بە خودا هەبێت، باوەڕێك کە ببێتە پاڵنەر بۆ جێبەجێکردنی بڕیارو فەرمانەکانی.. هەروەها باوەڕی هەبێت بەهاتنی ڕۆژی دوایی، کە هەموو ئادەمیزادەکانی تیادا زیندوو دەکرێنەوە.. هەروەها باوەڕی بە فریشتەکان و بە پێغەمبەرەکان و بە کتێبەکانی خودا هەبێت..

بەڵگەش لەسەر باوەڕ بوون بە قەدەر، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّا كُل شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾ [ سورەتی القمر : **49** ] .

واتا : بێگومان ئێمە هەموو شتێكمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریكراو دروستكردووە .

**پلەی سێهەم** : ئیحسان و چاكەكاری، ئەویش یەك پایەیە، كە بریتیە لە : بەندایەتی و خواپەرستی بەشێوەیەك بكەیت، وەك ئەوەی پەروەردگار ببینیت، خۆ ئەگەر تۆیش ئەو نەبینیت ئەو هەر تۆ دەبینیت، لەم بارەیەوە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ [ سورەتی النحل : 128 ]

واتا : بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە خۆیان پاراستووە لە گوناهو هەروەها ئەوانەش كە چـــاكەكارو چاكەخوازن .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ * الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ * وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ * إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ [ سورەتی : الشعراء 217-220] .

واتا : پشت بە خوای باڵا دەست ومیهرەبانت ببەستە * ئەو خوایەی كە تۆدەبینێ كاتێ ئەوەستی بۆ نوێژ كردن * ئەو زاتە تۆ دەبینێت كە چۆن لە ڕیزی سوژدەبەراندا هەڵس و كەوت دەكەیت * بەڕاستی ئەو خوایە زاتێكی بیسەرو زانایە .

هەروەها لە جێگایەكی دەفەرموێت : ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ﴾ [ سورەتی : یونس 61 ] .

واتا : بەهیچ كارێك هەڵناسی، هیچ بەشێك لە قورئان ناخوێنیتەوە (كە ئێمە ئاگادار نەبین، ئێوەش ئەی خەڵكینە) بە هیچ هەڵسوكەوتێك هەڵناسن كە ئێمە شایەت نەبین بەسەریەوە لەكاتێكدا ئەنجامی دەدەن و تیایدا ڕۆدەچن .

بەڵگەی سوننەتیش لە بارەی ئەم سێ پلەیەوە، فەرمووده بەناو بانگەكەی جوبرەئیلە كە عومەری كوڕی خەتاب ڕیوایەتی دەكات ودەگێڕێتەوە و دەڵێت : بينما جلوس عند رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ذات يوم إذ طلع علينا رجل ، شديد بياض، الثياب شديد سواد الشعر، لا يرى عليه أثر السفر، ولا يعرفه منا أحد، حتى جلس إلي النبي صلى الله عليه وسلم، فأسند ركبتيه إلي ركبتيه، ووضع كفيه على فخذيه، وقال يا محمد: أخبرني عن الإسلام. فقال: { أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا } فقال: صدقت. فعجبنا له يسأله ويصدقه. قال: فأخبرني عن الإيمان. قال: { أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وبالقدر خيره وشره } قال: صدقت. قال: فأخبرني عن الإحسان. قال: { أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك } قال: فأخبرني عن الساعة. قال: {ما المسؤول عنها بأعلم من السائل } قال: فأخبرني عن أمارتها. قال: {أن تلد الأمة ربتها وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في البنيان } قال: فمضى فلبثنا مليا. فقال { يا عمر أتدري من السائل } قلت: الله ورسوله أعلم. قال: { هذا جبريل أتاكم يعلمكم أمر دينكم } [ رواه مسلم رقم (1) ].

واتا : کاتێك لای پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) دانیشتبووین، پیاوێك لامان پەیدا بوو، جلوبەرگەکەی زۆر سپی بوون، پرچ وموووەکانی زۆر ڕەش بوون، ئاسەواری سەفەریشی بەسەرەوە نەدەبینرا، وە هیچ کەسێکیش لە ئیمە نەیدەناسی، تا ئەو کاتەی لای پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) دانیشت، و هەردوو ئەژنۆکانی نوساندن بە ئەژنۆکانی پێغەمبەری خواوە، وە هەردوو ناو لەپی خستە سەر ڕانەکانی، پاشان ووتی : ئەی موحەمەد لەبارەی ئیسلامەوە هەواڵم پێدە، ئەویش فەرمووی : ئیسلام ئەوەتانێ کە شاهیدی بدەیت کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە ( اللە )، وە شاهیدیش بدەیت کە موحەمەد پێغەمبەری خوایە، وە نوێژەکانت ئەنجام بدەیت، وزەکاتی ماڵو سامانت دەربکەیت، ووە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بیت، وە حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر هاتوو توانات هەبوو، ئەمجا جوبرەئیل ووتی : ڕاست دەکەیت، عومەر دەڵێت : زۆر سەرمان سوڕما، پرسیاری لێدەکات و پاشان پێیشی دەڵێت : ڕاست دەکەیت، پاشان جوبرەئیل ووتی : لەبارەی ئیمان و باوەڕەوە هەواڵمان بدەرێ، ئەویش فەرمووی : ئیمان ئەوەیە کە باوەڕت بە خوا و فریشتەکان وکتێبەکان وپێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و قەدەری خێر وشەڕ هەبێت، پاشان ووتی : ڕاستدەکەیت، ئەمجا جوبرەئیل ووتی : لەبارەی ئیحسان وچاکسازیەوە هەواڵم بدەرێ، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی : بەشێوەیەك خوا بپەرستیت، وەك ئەوەی پەروەردگار ببینیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەویش نەبینیت ئەو هەر تۆ دەبینیت، دواتر جوبرەئیل پرسیاری کرد و ووتی : هەواڵم بدەرێ لەبارەی ڕۆژی دواییەوە، لەوەڵامدا فەرمووی : ئەو کەسەی کە پرسیاری لێدەکرێت لەو کەسە شارەزاتر نیە کە پرسیار دەکات، ئەمجا جوبرەئیل ووتی : هەواڵم بدەرێ لەبارەی نیشانەکانیەوە، ئەویش فەرمووی : کەنیزەك گەورە وخاوەنەکەی خۆی لێ دەبێت، وە پێپەتی و هەژار و شوانی مەڕەکان ببینیت کە پێشبڕکێ بکەن لە بەرزکردنەوەی باڵەخانەکاندا، عومەر دەڵێت : ئەمجا جوبرەئیل ڕۆشت وئێمەیش ماوەیەك چاوەڕیمان کرد، پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) فەرمووی : ئەی عومەر ئایا دەزانیت ئەو کەسە کێ بوو پرسیارەکانی دەکرد ؟ عومەر دەڵێت : ووتم : خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی : ئەو کەسە جوبرەئیل بوو هاتبوو بۆ ئەوەی ئاینەکەتان فێر بکات و شارەزاتان بکات لێی .

## بنچینە وبنەمای سێهەم : ناسینی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم )

پێغەمبەرەکەتان موحەحەمەدە ( صلى الله عليه وسلم )، ئەویش موحەمەدی کوڕی عبد الله ی کوڕی عبد المطلب ی کوڕی هاشمە، هاشمیش لە هۆزی قوڕەیشە، قوڕەیشیش لە عەرەبە، عەرەبیش لە وەچەوە ونەوەکانی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی خەلیلن، چاکترین و باشترین صەڵات وسەلام لەسەر ئەوان و پێغەمبەری خۆیشمان بێت، تەمەنی شەست وسێ ساڵ بووە، چل ساڵیان پێش پێغەمبەرایەتی بووە، و بیست وسێ ساڵی تریان هەواڵ پێدراو و نێرراو بووە، هەواڵ پێدراو بووە بە سەرەتای سورەتی ( إقرأ ) و نێرراویش بووە بە سەرەتای سورەتی ( المدثر )، خەڵکی شاری مەککە بووە، و پاشان کۆچی کردووە بۆ شاری مەدینە، خوای گەورە ناردویەتی بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لە مەترسی هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا، وبانگەوازی خەڵکیش بکات بۆ یەکخواپەرستی، بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ * وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ * وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ * وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ * وَلا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ * وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴾ [ سورەتی المدثر : **1-7** ] .

واتا : ئەی ئەو کەسەی بە جل و بەرگەکانی خۆی داپۆشیوە! هەستە فەرمانەکانی خودا بە خەڵکی ڕابگەیەنە * ناوی پەروەردگارت بە گەورەیی بهێنەو بە بەرزیی و بڵندیی ڕایبگرە، چونکە گەورەیی تەواو هەر بۆ خودایە * جل و بەرگەکانت بە خاوێنی و بە پاکیی ڕابگرە... هەندێك دەڵێن مەبەست لەم فەرمانە ئەوەیە کە دڵت لە هەموو جۆرە گوناهێك بە دوور ڕابگرەو با هەمیشە دڵت پەیوەست بێت بە خودای پەروەردگارتەوە * خۆت لە هەموو کارێك و لە هەموو قسەو گوتارێك کە گوناهی بەدواوە بێت، بە دوور بگرە * ئەوەی دەیبەخشیت بە هەژاران، منەتی لەگەڵدا مەکەو بەزۆری مەزانە ، یاخود خۆت دوور بگرە لە منەت کردن بەرانبەر ڕێنمایی کردنی خەڵکی بۆ سەر ڕێگای خوداو کردەوەکانی خۆت بە زۆر مەزانە * خۆت لەسەر ئەو فەرمانانەی کە لەلایەن خوداوە بۆت دێت ڕابگرەو بە چاکیی ئەنجامیان بدەو بەبێ سستی و دواخستن ڕایانبگەیەنە بە خەڵکی ..

مانای خەڵکی لە شیرك و هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە ئاگادار بکاتەوە و بانگەوازیشیان بکات بۆ یەکخواپەرستی، وە مەبەستیش لە یەکخواپەرستی پەروەردگارت بەرز وبڵند ڕابگرە، وە مەبەست لە کاروکردەوەکانت لە شیرك وهاوەڵ بڕیاردان پاك بکەرەوە، وە مانای : الرجز : مەبەست لێی بتەکانە، واتا : پشت لە بتەکان و لەو کەسانەش بکە کە دەیانپەرستن، وە دوور کەوتنەوە و دووره پەرێز بوون ودابڕان لەو خەڵکانەش کە بت پەرستن .

پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ماوەی دە ساڵ بەردەوام بوو لەسەر بانگەواز کردن بۆ یەکخواپەرستی، وە دوای ئەو دە ساڵە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانەکان، و پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرا – لەسەر خۆی ولەسەر ئومەتەکەی – دواتر سێ ساڵ لە شاری مەککە نوێژی کرد، پاشان فەرمانی پێکرا کۆچ بکات ۆ شاری مەدینە .

هیجرەت واتا : کۆچکردن وگواستنەوە لە وولاّتی شیرك وهاوەڵ بڕیاردانەوە بۆ وولاّتی ئیسلام وموسڵمانان، ئەم کۆچکردنەش لە وولاّتی شیرك وهاوەڵ بڕیاردانەوە بۆ وولاّتی ئیسلام وموسڵمانان فەریزەیەکە لەسەر ئومەتی ئیسلامی، ئەمەش هەتاکو هاتنی ڕۆژی دوایی دەمێنێت وبەردەوام دەبێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ الذِينَ تَوَفَّاهُمُ المَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً * إِلا المُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَال وَالنِّسَاءِ وَالوِلدَانِ لا يَسْتَطِيعُونَ حِيلةً وَلا يَهْتَدُونَ سَبِيلاً * فَأُولئِكَ عَسَى اللهُ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللهُ عَفُوّاً غَفُوراً ﴾ [ سورەتی النساء : **97-99** ] .

واتا : هەندێك لەوانەی لە مەککەدا موسڵمان بووبوون، لەبەر ئەو ماڵ و سەروەتەی هەیانبوو هەر لە مەککەدا مابوونەوەو کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە، تا لەوێ ژمارەی موسڵمانان لە مەدینەدا زیاد بێت و لەگەڵیاندا بەرانبەر دوژمن بوەستن، وە ڕازی بوون بەو ژیانە دژوارو ناخۆشەی کە لەناو بتپەرستەکاندا لە مەککە هەیانبوو، ئەمە لە حاڵێکدا کە کۆچکردنیان لەسەر پێویست کرابوو، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە ستەمیان لە خۆیان کردووە، بەوەی لەناو بتپەرستەکاندا ماونەتەوە، لەکاتی گیان لێ سەندنەوەیاندا فریشتەکان پێیان دەڵێن : بۆچی بە زەلیلی لەناو بتپەرستەکاندا مانەوەو کۆچتان نەکرد، تا بەباشی پەیڕەوی ئایینەکەتان بن؟! ئەوانیش لە وەڵامدا ووتیان: بێ تواناو دەستبەسەر بووین.. ئینجا فریشتەکان ووتیان: بۆچی بە زەلیلی قایل بوون، ئایا سەر زەوی خودا فراوان نەبوو کۆچ بکەن تا لە بتپەرستەکان ڕزگارتان ببێت؟! ئەوانە ئەگەر باوەڕیان بە ئایینەکەیان قایم بوایە لە کۆچکردن بەجێ نەدەمان، لە حاڵێکدا کە کۆچ پێویست کرابوو لەسەریان.. بۆیە جێگەیان دۆزەخە، کە سەرەنجامێکی زۆر ناخۆشەو خراپترین ئاکامە * جگە ئەوانەیان نەبێت کە بەڕاستیی بێ هێزو بێ توانان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان، ڕێگای کۆچکردنیان ئاسان نیەو بۆیان نالوێت، وە توانایان نیە هیچ هەوڵێك بدەن بۆ ڕزگارکردنی خۆیان * ئەوانە سزا نایانگرێتەوەو، ئومێد وایە بکەونە بەر لێخۆشبوونی خودا، چونکە خودا زۆر لێبوردەو لێخۆشبووە .

هەروەها لەم بارەیەوە فەرموویەتی : ﴿ يَا عِبَادِيَ الذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ ﴾ [ سورەتی العنكبوت **56** ] .

خوای گەورە بەو بەندانەی کە گیریان خواردووە لەناو بێباوەڕاندا دەفەرموێت : ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زەوی من فراوانە بۆ کۆچکردن وخۆتان ڕزگار بکەن لە زوڵم وستەم، وە بەتەنها هەر من بپەرستن .

ئیمامی بەغەوی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێت : هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەبووە کۆمەڵێك لەو موسڵمانانانەی کە لەشاری مەککە مابوونەوە کۆچیان نەکردبوو، بۆیە خوای گەورە بەناوی باوەڕەوە بانگی کردوون، - و هانی داوون کە کۆچ بکەن - :

بەڵگەش لەسەر کۆچکردن لە سوننەت، ئەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : { لا تنقطع الهجرة حتى تنقطع التوبة ولا تنقطع التوبة حتى تطلع الشمس من مغربها } واتا : کۆچکردن کۆتایی نایەت، هەتا ئەو ڕۆژەی کە تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە کۆتایی نەیەت، تەوبە و گەڕانەوەش کۆتایی نایەت هەتا ئەو کاتەی کە ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت .

جا کاتێك پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە شاری مەدینە جێگیر بوو، فەرمانی پێکرا بە ئەحکامەکانی تری شەریعەتی ئیسلام، وەك زەکات و ڕۆژوو و حەج و جیهاد و بانگ و فەرمان بەچاکە و ڕێگری کردن لەخراپە و زۆرێکی تر لە ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام، ئەم قۆناغەش ماوەی دە ساڵی پێچوو، لەدوای ئەوە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وەفاتی کرد، بەڵام ئاینەکەی مایەوە و تا ئێستاش بەردەوامە وئەمەش ئاینەکەیەتی، هیچ کارێکی خێر وچاکە نیە ئیلا پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ڕێنومایی ئومەتەکەی کردووە بۆی، لە هەمان کاتدا ئاگاداریشی کردوونەتەوە لە هەموو خراپە وکارێکی ناپەسند، وە ئەو خێر وچاکەیەی کە ئومەتەکەی بۆ ڕێنومایی کردووە بریتیە لە یەکخواپەرستی و تەواوی ئەوەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێت و وپێی ڕازیە، وە ئەو شەڕ وخراپەیەی کە ئومەتەکەی لێ ئاگادار کردوەتەوە، بریتیە لە شیرك و هاوەڵ بڕیاردان و تەواوی ئەوەیشی کە خوا ( جل جلاله ) پێی ناخۆشە ونایەوێت ..

خوای گەورە پێغەمبەری ( صلى الله عليه وسلم ) ناردووە بۆ گشت خەڵکی، وە گوێڕایەڵی وطاعەتی ئەوی فەرز کردووە لەسەر تەواوی جنۆکە ومرۆڤەکان، ئەویش بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە خوای گەورە دەفەرموێت : واتا : ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً ﴾ . [ سورەتی الاعراف : **158** ] .

ئەی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) بڵێ: ئەی خەڵکینە! بێگومان بەڕاستی من پێغەمبەرو فرستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی .

خوای گەورە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی هەر بەو پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) کامڵ و تەواو کرد، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموویەتی :﴿ اليَوْمَ أَكْمَلتُ لكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَليْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لكُمُ الأِسْلامَ دِيناً ﴾ [ سورەتی المائدة : 3].

واتا : ئەمڕۆ هەموو فەرمانەکانی ئاینەکەتانم بۆ تەواو کردن و گەیاندم بەکۆتایی ، و ڕێگای خواناسی و شەریعەتەکانم بە تەواوی بۆ ئاشکرا کردن، هەروەها فەزڵ و بەخششی خۆیشم بۆ تەواو کردن، وە ڕازیم بەوەی ئاینی ئیسلام ببێتە ئاینتان، کە دوا بەرنامەی خودایەو بۆ هەموو کات و شوێنێك دەگونجێت .

بەڵگەش لەسەر مردنی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ*ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ عِنْدَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ [ سورەتی الزمر : 30 -31 ] .

واتا : بەڕاستی تۆش دەمریت و ئەوانیش دەمرن و کەس نامێنێت * جا ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو ڕۆژەدا تۆو ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ نەدەکردیت و بە درۆزنیان دادەنایت، لەلای خودای پەروەردگارتان دەکەونە موحاکەمە، ئەو کاتە دەردەکەوێت کە کام لاتان لەسەر حەق و ڕاستیی بوون؟

خەڵکیش پاش مردن زیندوو دەکـــرێنەوە، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ مِنْهَا خَلقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى ﴾ [ سورەتی طه : 55 ] .

واتا : لەم زەویە دروستمان کردون دووبارە دەتانگێڕینەوە بۆ ناو زەوی ، وە جارێکی تر لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە و زیندوتان دەکەینەوە ( بۆ لێپرسینەوە ) .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَاللهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الأَرْضِ نَبَاتاً * ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجاً ﴾ [ سورەتی نوح 17 -18 ].

واتا : هەر خوا خۆی ئێوەی لە خاك بەدیهێناوەو پێی گەیاندوون * پاشان دەتانمرێنێت و دەتانخاتەوە ناوی هەر کاتیش بیەوێت دەرتان دەهێنێتەوە .

پاش زیندوو کردنەوەیش لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێت و پاشان پاداشتی کردەوەکانتان وەردەگرنەوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَللهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ لِيَجْزِيَ الذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلوا وَيَجْزِيَ الذِينَ أَحْسَنُوا بِالحُسْنَى ﴾ [ سورەتی النجم : 31 ] .

واتا : هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیەتی، (تاقیتان دەکاتەوە) بۆ ئەوەی تۆڵەبسێنێت لەوانەی کەخراپەیان کردووەبەگوێرەی کردەوەکانیان، وە پاداشتی ئەوانەش کەچاکەیان کردووەبەچاکترین شێوە بداتەوە .

هەر کەسێکیش زیندوو بوونەوە بەدرۆ بزانێت ئەوە بێباوەڕ بووە، بەڵگەش بۆ ئەمە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ زَعَمَ الذِينَ كَفَرُوا أَنْ لَنْ يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلتُمْ وَذَلكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ ﴾ [ سورەتی التغابن : 7 ] .

واتا : بێ باوەڕەکان گومانیان وابوو کە لە دوای مردنیان هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەوانە بڵێ: ئێوە بە هەڵەدا چوون... سوێند بە خودای پەروەردگارم بەبێ هیچ گومانێك ئێوە زیندوو دەکرێنەوەو ژیانێکی نوێتان پێ دەبەخشرێت، وە پاشای ئەوەی کە لە دنیادا کردووتانە بەبیرتان دەهێنرێتەوەو ئەو زیندوو کردنەوەیش لەلای خودا کارێکی زۆر ئاسانە .

خوای گەورە سەرجەم پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی موژدە بدەن بە خواناس و چاکەکاران بە ڕەزامەندی خوا و بەهەشتی نەبڕاوە، وە بێباوەڕان و خراپەکارنیش بترسێنن بە سزای دۆزەخ، بەڵگەش بۆ ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ رُسلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لئَلا يَكُونَ للنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُل ﴾ [ سورەتی النساء : 165 ] .

واتا : ئەم پێغەمبەرانە نێرراون تا ڕێگای خواناسین بە خەڵکی پیشان بدەن و، موژدەی خۆشی بدەن بە چاکەکاران، وە بێ باوەڕان و ستەمکارو خراپەکارانیش بترسێنن، تا خەڵکی بەڵگەیان نەبێت لای خوداو بڵێن : خودایە ئێمە نەمانزانی ڕێگای ڕاست کامەیە .

وە نوح ( سەلامی خوای لێ بێت ) یەکەمین پێغەمبەرە لەو پێغەمبەرانە، و موحەممەدیش کۆتا ودوایینیانە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە یەکەمینیان نوحە ( سەلامی خوای لێ بێت ) خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِليْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِه ﴾ [ سورەتی النساء : 165 ] .

واتا : ئەی موحەمەد ئێمە وەحیمان بۆ تۆ ناردووە، هەروەك بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەویشمان ناردووە .

هەموو گەل و نەتەوەیەکیش خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، لە نوحەوە تاوەکو موحەمەد، فەرمانی پێکردوون کە خوای گەورە بە تاکو تەنهایی بپەرستن، وریگریشی لێکردوون کە جگە لە خوا هیچ شتێکی تر بپەرستن، بەلگەش بۆ ئەمە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَلقَدْ بَعَثْنَا فِي كُل أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ [ سورەتی النحل : 36].

واتا : سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر جگە لە ( الله ) .

خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر تەواوی بەندەکانی کە باوەڕیان نەبێت بەهەر شتیك جگە لەخۆی بپەرسترێت، لە هەمان کاتدا فەرمانی پێکردوون کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها زاتی هەق تەعالای ( الله ) بهێنن، ابن القیم ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) ئەڵێت : تاغوت هەر شتێکە کە بەندە لە سنووری خۆی تێپەڕێنێت، لە پەرستراو، و چاولێکراو گوێرایەڵی بۆ کراو ..

جا تاغوتەکان زۆرن، سەرکردە و سەرەکانیان پێنجن : شەیتان نەفرینی خوای لێ بێت، وە هەرکەسێکیش بپەرسترێت و ڕازی بێت بەو پەرستنە، وە هەرکەسێکیش کە خەڵکی بانگ بکات بۆ پەرستنی خۆی، وە هەرکەسێکیش بانگەشەی زانینی شتێك لە زانستی غەیب و شتە نهێنی و شاراوەکان بکات، وە هەر کەسێك حوکم بەشتێك بکات جگە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ [ سورەتی البقرة : **256** ] .

واتا : باوەڕهێنان بە ئایین هیچ زۆرەملێ یەکی تیادا نیەو، نابێت بە زۆر بێت، خودا ڕێگای ڕاستی لە ڕێگای چەوت جیاکردۆتەوە، جا هەر کەس بێباوەڕ بێت بە تاغوت ( هەر شتێك جگە لەخوا بپەرسترێت ) وە باوەڕ بهێنێت بەخودا، ئەوە بێگومان دەستی گرتووە بە گرێ توند وتۆڵەکەی یەکخواپەرستیەوە، کە بچڕانی بۆ نیە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، ، وە خوای گەورەش بیسەر و زانایە، هەر ئەمەش مانای تەواوی ( لا إله إلا الله ) یە .

لە فەرموودەی پێغەمبەری خوایشدا هاتووە کە دەفەرموێت : { رأس الامر الاسلام، وعموده الصلاة، وذروة سنامه الجهاد في سبيل الله } واتا : سەری هەموو شتێك ئیسلامە، و پایە و کۆڵەکەکانیشی نوێژ کردنە، وە لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلام و چڵەپۆپەکەی جهاد و تێکۆشانە لە ڕێگای خوادا، خوای گەورەش زاناترە ،،،

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .**

**ڕۆژی دوو شەممە 11 / شوال / 1346 کۆچی**

**بەرامبەر 27 / تەموز / ساڵی 2015 زاینی بەیارمەتی خوای گەورە لە وەرگێرانی ئەم پەرتووکە بومەوە .**

**ئومێد چرۆستانی**